تەنها بەدیاری دەبەخشرێ

زنجیرە ( ١ )

# پەیامەکانی بەرەو بەهەشت



گۆڕ

بەکەم زانینی دونیا

شەونوێژ

بەرزەخ

ئامادەکرنی

باوکی چیای خولەکان

١٤٣٨ك

٢٠١٦ز

زەنجیرە

(١)

# پەیامەکانی بەرەو بەهەشت

(بەکەم زانینی دونیا – گۆڕ - بەرزەخ- شەونوێژ)


ئامادەکردن

باوکی چیای خولەکان



١٤٣٨ك ٢٠١٦ ز

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: چەند پەیامێك بەرەو بەهەشت

ئامادەکردنی: باوکی چیای خولەکان

دیزاینی ناوەرۆك: باوکی ماکوان

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: (رۆژهەلات) هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی (  ٦٣٠ )ی

ساڵی (٢٠١٦)ی دراوەتێ

# پێشەکی

پـشت بــەخودای میهرەبــان کــە ئێمــە چــەند ســاڵێك بــووزنجیرەی بــەرەو بەهەشــتمان بڵادەکــردەوە، چــەند خوێنــەرێکی قــەدرگران داوایــان کــرد ئــەم بڵاوکراوانــە کۆبکرێتەوە لەچەند کتێبێکدا چاپ بکرێ، جائێمەش بەناوی خودای گەورە هەڵساین بەم کۆکردنەوەی چەند ژمارەیەك (کۆن و نوێ)ی زنجیرەکانی بەرەو بەهەشت لەدوو توێی نامیلکەیەك بەناوی چەند پەیامێکی بەرەو بەهەشت و دووبارە زنجیرە بۆ دانانەوەی ، بێگومان تەنهاو تەنها کتێبی خودا بێ هەڵەیەو چاوپۆشی بکەن لەهەڵەکانم دوعام بۆ بکەن خودا لێمی قبول کردبێ، لەکۆتایی لە خودای باڵا دەست دەپاڕێمەوە ئەمانەش بەشداری پێ بکات لە ئەجرو پاداشتەکەی. لەوان دایكو باوکمو مامۆستاکانمو خێزانە باشەکەمو مامۆستایانی خولەکانمان بەتایبەتی باوکی (عبدالله)ی عابید و هەموو هاوکاران و یارمەتی دەرانم.

**باوکی چیای خولەکان**

٢٠١٦

# بەكەم زانینی دونیا

**الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين**

بێ گومان لای هەندێ كەس ئەم پرسیارانە دروست دەبێ، ئایا بۆچی هاتوینە دونیا؟ مەبەست لەم ژیانە چییە؟ سەرەنجامو دوارۆژمان بۆ كوێ دەروات؟ ئایا...، وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە لەقورئانو فەرمودە پیرۆزەكان وەردەگرین و تێ دەگەین كە مرۆڤ هەروا بە خۆڕایی دروست نەكراوە، بەڵكو ئەركێكی پیرۆزی لەسەر شانە، ئینجا دەزانین ئەم دونیایە كورتەو دەبڕێتەوە ژیانی راستەقینەو هەمیشەیی پاش مردن دەست پێ دەكات كەواتە ئەم پێنجو دوو رۆژەی دونیا تەنها بۆ چاندنە(چاكە یان خراپە)یەو دورینەوەو بەرهەمیشی لەقیامەتە، ئیتر یان بەهەشت یان دۆزەخ خوا پەنامان بدات.

# بۆچی هاتوینە دونیا

ئەگەر كەسانێك بایەخیان بە ئاخیرەت نەدا، گریمان هاتونەتە دونیا بۆ لەسەر یەك دانانو كاركردن بێ، ئەی بۆچی پەكمان دەكەوێو لەكاردەكەوین؟ یان بۆ رابواردنو خۆشی، ئەی بۆچی ماندوو برسیو پیرو نەخۆش دەكەوین؟ یان بۆ بنیادنانو دروست كردن، ئەی بۆچی هەر خۆمان تێكی دەدەینو دەیروخێنینو بەجێی دێلین؟ گرنگ ئەگەر وا بزانی دەژین بەس بۆ ئەم (ژیانە) پێت دەڵێن: ئەی بۆچی دەمرین؟!!!

نا...نا...نەخێر بیر بکەوە ئێمە ئێستا قۆڵمان لەم دونیایە هەڵکردووە خۆ ماوەیەك لەمەو پێش بوونمان نەبوو و دوای چەند ساڵێکی تر لەم جیهانە دەردەچین‌و نامینێین.

سەرگەردانی بەسە، با بگەڕێینەوە لای خالیقەکەمان کە خۆی ئێمەی دروست کردووەو ڕێ نموییمان دەکات و دەفەرموێ ﴿ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٦﴾ ﴾

لەلایەن خوداوە پێغەمبەرو قورئانێکی روون‌و ئاشکرامان بۆ رەوانە کراوە کە خودا بە هۆیەوە ڕێ بەو ئیماندارانە نیشان دەدات کە شوێن رەزامەندی ئەو دەکەون کە بریتی یە لەیاساو حوکمەکانی خودا، بە ئیزنی ئەو لەتاریکستانی کوفر بەرەو رووناکی ئیمان دەریان دەهێنێ و هیدایەتان بۆ سەر ڕێگەیەکی راست‌و دروست دەدات.

# ژیانی دونیا تاقی کردنەوەیە

لـــەقورئان هـــاتووە ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾ ئایا ئێوە واتان حسێب کردووە بە گاڵتەو بێ مەبەست ئێوەمان دروست کردووە، نا ...نەخێر بێ مەبەستو لەخۆڕایی نیە بەڵکو بۆ کارێکی زۆر پیرۆزو گرنگ دروست کراوین ئەویش عیبادەتو پەرستنە، ئەم دونیایەش شوێنی ئەو تاقی کردنەوەیە بۆ ئەم عیبادەتە تاکو دەرکەوێ کێ خودا دەپەرستیو کێش هەڵدەگەڕێتەوە کێ چاکە دەکات و ڕێی خوداو ئیمان هەڵدەبژێرێ ، کێش خراپەو ڕێی شەیتانو کوفر هەڵدەبژێرێ، خودای گەورە فەرمویەتی : ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾ الملك:٢.

ئەو خودایەی مردنو ژیانی دروست کردووە بۆ ئەوەیە تاقیتان بکاتەوە ئایا کامتان باشترین کردەوە ئەنجام دەدەن، کەواتە ئەم جیهانە کورتەی دونیا بۆ کردەوەو چاندنە هەروەکو باپیرانمان هاتنو چاندیانو ڕۆیشتن، ئەو ماوە کورتەی پێیاندرابوو بەسەریان برد لەدونیا، ئێمەش ئێواریێ دەمرین و بەجێی دێڵین ، دەڕۆین بۆ جیهانی ئاخیرەت و جەزادانەوە کە تێیدا هەموو کەس لەبەردەستی خودای خۆی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێو جەزای کارەکانی دەدرێتەوە مردنیش پردێکە بۆ پەڕینەوە لەجیهانی دونیا بۆ جیهانی ئاخیرەت.

# میهرەبان چاکەی لەگەڵ کردوین

بەڵێ بەهەشت پاداشتی ئیمانداروو چاکەکارانەو دۆزەخ سزای کافرو خراپەکارانە، هەردوو ڕێگاشی زۆر بە درێژی رون کردۆتەوە. بە ناردنی کتێبو پێغەمبەران( علیهم الصلاة والسلام) هەروەکو فەرمویەتی : ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾ بێگومان بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێكمان نارد تاوەکو خوداپەرستنو لەتاغوت دوربکەونەوە، بەڵێ ئەوان خودایان بە ئێمە ناساند ، فێری باوەڕو خواپەرستیان کردین، ئەوەی چاکە بوو بە ئێمە یان فەرمووە هیچیان جێ نەهێشتووە.

پاشان خودای گەورە سەربەستی داوە بە مرۆڤ بێ زۆر لێ کردن کام ڕێگا دەگری ئازادە وەکو فەرمویەتی ﴿ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾ . تاکو کافرو تاوانباران بێ بیانوو بن لەئاخیرەت کاتێ ڕێگا سەختو دژوارو ناخۆشەکەیان گرت خودا زیاتر بۆیان روون دەکاتەوە ﴿ وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾ . واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: هەقو ڕەوا لەلای پەروەردگارتانەوەیە، جا ئەوەی

ویستی با ئیمان بهێنێ، وە ئەوەی ویستی با کوفر بکات، ئێمە ئاگرێکمان بۆ ستەمکاران ئامادەکردووە کە شوورەکەی دەوری گرتووە، وە ئەگەر داوای ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەبردرێ وەکو روونی قرچاو یان کانزای تواوەیە سەر و رووی دەبرژێنێ، بەراستی خواردنەوەیەکی بەدو خراپە وەئاگرەکەش جێگایەکی ناهەموارە.

# کردەوەکانت تۆمارکراون

مادام ژیانی دونیا تاقی کردنەوەیە کەواتە کردەوەکانت وردو درشتو چاکو خراپوو کردارو گوفتار تۆمار دەکرێن، خودای دەسەڵاتدار دوو فریشتەی چاودێری بۆ هەر مرۆڤێك داناوە، ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ (١٠) كِرَامًا كَاتِبِينَ (١١) يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ (١٢) إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (١٣) ﴾. بێ گومان چەند فریشتەیەکتان بەسەرەوەیە کە بەرێزنو نوسەری کردەوەکانتان هەرچی بیکەن دەیزانن.

﴿ مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ (١٨) ﴾ کە مردیش کتابەکە دادەخرێ لەقیامەت لەمەیدانی موحاکەمە بەپێی کردەوەکانت مامەڵەت لەگەڵ دەکرێ.

سەرەنجام یان سەرکەوتوویی واصحاب الیمین وبەهەشتی یان ساقیتو اصحاب الشمال و دۆزەخی (خودا پەنامان بدات)، پێش هەموو شتێك سەرکەوتووەکان دەکەونە ناو رەزامەندیو لێخۆشبونی خودا لەدۆزەخ قوتاریان دەبێو بەرێزەوە دەفەرموون بۆ بەهەشت کە شوێنی

حەسانەوەو رابواردن‌و هەموو خۆشیەكە، ووشەی ماندوو بوون‌و كاسبی‌و پیری‌و مردنی تێدا نیە.

وا وەیلاش بۆ دۆڕاوەكان كاتێ دەكەونە بەر تورەیی خودا كە گەورەترین كارەساتە ، كۆت‌و زنجیر دەكرێن ولەسەر روو رادەكێشرێن بەرەو دۆزەخ‌و چونكە خودا ئەمر دەكات ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ﴾. ئەو دۆزەخەی مەگەر خودا خۆی بزانێ چی تیایە؟!

# قیامەت مەگۆڕەوە بە دونیای فانی

شەیتان فێڵت لێ نەكات بڵێی با لەدنیا بە ئارەزوی خۆم رابوێرم لەقیامەتیش چی دەبێ با ببێ چونكە

**١-ژیانی دونیا ماوەیەكی زۆر كورتە:**

خۆ ئەگەر هیچ مەترسیەكی مردنی لەسەر نەبێ وەكو جەلدەو ئاگرو خنكان‌و وەرگەڕان لەئۆتۆمبێل‌و...ئەوا گریمان گەیشتیە كۆتایی تەمەنت كە نزیكە ٨٠ ساڵ بێت منداڵی‌و پیری‌و خەوی لێ دەربكە نیوە دەمێنێ لەوە نیوەی بۆ ئیش‌و كارو كاسبی‌و نان پەیداكردنە باشە چی دەمینێتەوە؟ بەراستی زۆر كورتە. بۆیە قورئان فەرمویەتی لەباسی ژیانی دونیا ﴿ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ ﴿٤٥﴾ ﴾، ﴿ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ ﴾

### ٢-ئەوەی لەدنیا دەستت دەكەوێت هەمووی دەڕوات:

هەر چیەكت دەست دەكەوێت لەپارە بە ملیۆنان، لەئافرەت جوانترین، لەخانوو بە مۆدیلترین، پلەو پایەو شەهادە لە مەزنترین، هەموی جێ دەهێلیو هیچ لەگەڵ خۆت نابەی بۆ ئاخیرەت.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ( یتبع المیت ثلاثة، فیرجع اثنان ویبقی معه واحدٌ، فیرجع اهله وماله ویبقی عمله ) بخاری ومسلم، سێ شت بەدوای مردودا دەڕوات جا دوویان دەگەڕێنەوەو یەكیان لەگەڵیدا دەمینێتەوە.

### ٣-ئەوەی رووی تێ دەكات هەرگیز خێرو خۆشی نابینێ:

سەیری دونیاییەكان بكە هەرچەندی پارەو سامانی زۆرتر بەدەست دێنن زیاترماندوو شەكەتو پەریشانتر دەبن، خۆ دەتوانن بە زەبری پارە هەموو شتێك بكڕن بەلاَم هەرگیز ناتوانن ئاسودەییو خۆشی بۆ دڵیان بكڕن، چونكە بێ گومان خێرو خۆشیو كامەرانی راستەقینە نایەتەدی بە ئیمان نەبێ.

كاتێ دونیا دەبێتە ئاواتو ئامانجیان هەرچی پەیدای دەكەن لەبەر چاویان هەركەمە ئەگەر ملیۆنەكی هەبێ دەڵێ دە ملیۆن باشە، دەی هەبێ دەڵێ پەنجا باشە دوایی دەڵێ ملیارێك باشە هەردەم خۆی بەهەژار دەبینێ، پارەش ژمارەیە، ژمارەش كۆتایێ نایێ كەواتە ناگاتە ئاواتەكەی تا خۆشی بەدەست بێنێ بەڵكو بەردەوام ماندوو پەرێشانە هەروەكو لە(بخاریو موسلم) دا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئەگەر

ئادەمیزاد دۆلێك زێڕی بدرێتێ حەزی لەهی دووەمە، ئەگەر دووەمی بدرێتێ حەزی لەهی سێ یەمە، چاوی بە هیچ پڕ نابێتەوە مەگەر بەخۆڵی مردن نەبێ.

**٤-ژیانی دنیا یەکجارەو کورتە، ئاخیرەتیش بەردەوامو بە نرخە:**

بەڵێ یەکجارە، کاتێ ساقیتەکان بەرەو دۆزەخ دەبردرێن پاش پاڕانەوەیەکی زۆر بۆ گەڕانەوە بۆ دنیا بێ هیمێد دەبن و بە پەژارەو داخەوە دەڵێن ﴿فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾﴾ . وای ئەگەر یەك گەڕانەوەی ترمان بۆ هەبوایە ئەو جارە چۆن لەئیمانداران دەبوین بەڵکو خودا دەفەرموێ ﴿كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾

نەخێر ئەوە هەرووشەیەکە و گوتویەتی (بێ سودو بێ هودەیە) بەڵکو هەرگیز جارێکی تر تاقی ناکرێنەوە، بەڵکو دەفەرموێ ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾﴾ . واتە هەر شتێکی پێتان دراوە هەندێك خۆشیو رازاوەی دنیایە وە ئەوەی لای خودایە چاکترەو بەردەوامترە ئەی بۆ ئێوە بیرناکەونەوەو تێ ناگەن.

# بەندەكانی خوا

بەندەكانی خوا، خوداو پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداریان كردینەوە لەكەمی دنیاو گرنگی ئاخیرەت، هەروەكو دەفەرموێ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ ﴾

واتە: هۆ خەڵكینە بەڵێنو وادەی خودا راستو هەقە جا ژیانی دنیا فریوتان نەدات و شەیتانیش لەخودای گەورەتان هەڵنەفریوێنێ. (ئاسان).

لە(مسلم)دا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ( ان الدنیا حلوة خضرة وان الله مستخلفكم فیها فینظر كیف تعملون فاتقوا الدنیا واتقوا النساء)

واتە/ دنیا شیرینو سەوزە و خودا ئێوەی تێدا جێ نشین كردووە، جا تەماشا دەكات چۆن كردار دەكەن، كەواتە خۆتان لەدنیا بپارێزنو خۆتان لەئافرەتان بپارێزن.

والله خۆشی دنیا زۆر كەمە و ئەوەی بیەوێ خودا كەمێكی دەداتێ بەڵام ئاخیرەتی سەخت دەبێ هەروەكو لەبارەی دنیای كافرەكان دەفەرموێ ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ ﴾. كەمێك خۆشیو رابواردنیان دەدەینێ ئینجا دوچاری سزایەكی سەختو توندیان دەكەین ﴿ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾ . واتە: دە بیخۆن و رابوێرن كەمێك لەدنیا چونكە ئێوە موجریمو تاوانبارن.

# هەڵ مەخەڵەتێ:

هەڵمەخەڵەتێ براو خوشکی ئیماندارم بەدنیا پەرستەکان ئەوانەی بەشێك دنیایان بە دەست هێناوە رادەبوێرن لەگەڵ ئافرەتێك پیاسەدەکەن یا ئۆتۆمبێلی ئاخیر مۆدیل دەخورن یان قەسرێکی بڵندیان کردووە یان .....) ئەمانە نەبێتە هۆی ئەوەی ئێمەش بڵێین باوەکو وان بکەین، چونکە نەفس و شەیتان وات لێ دەکەن ئەوەی دەورویەرت بە دەستیان هێناوە تۆش بەدەستی بێنی بۆیە قورئان دەفەرموێ ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾﴾ . چونکە ئیماندار ئەوی خودا بۆی ئامادەکردووە خێرو ئاسودەیی‌و کامەرانی راستەقینەو نەبراوەیە و هەولی تەواوی بۆ دەدات لەدەست خۆی نادات خودایە بەقیسمەتی ئێمەش بکەی .ئامین.

# گــۆڕ

پیاو صالحان‌و ئەولیاکانی خوا هەر کاتێك بێ تاقـەتی‌و مانـدوبوون‌و کزبونایە سەردانی گۆڕیان گۆرستانیان دەکرد ئیتر لەوێ هەموو خەفەتی دونیاو خەم لێ خواردنیـان لـەدونیا هەڵدەرێـشت و تـەپو تـۆزی دونیـاو نەفس‌و شەیتانیان لەخۆ هەڵدەوەرانـدو بیریـان لـەم گـۆڕەو ژیـانی نـاوی دەکردەوەو تاوایان لێ دەهات چـاوەکان دەیانبارانـد فرمێـسکی تـەوبـەو گەڕانــەوە بـۆ لای خـواو سـەرەنجام دونیـا لـەدڵیان بـچوك دەبویـەوە خەمەکانیش لەو بچوك ترئینجا قەبرو قیامەتیان لەلا گەورە دەبوو تەواو روویان لەدوارۆژدەکرد، ئیتر خوای میهرەبان دەرگای دڵیانی دەکردەوەو پڕ دەبوو لەخۆشەویستی و ئومێدو تـرس، بـیر و فکریـان تێکـڕا دەبـوە یادو زیکری خواو یادی خواش واتا ئاسـوودەیی‌و بەختـەوەری وئـارامی، بۆیـە ئـەولیاکانی خـوا لەسـەر فەرمایـشتی پێغەمبـەری خۆشەویـست کەفەرموویەتی (نهیتكم عن زیارە القبور ، فزوروها) قال الالبانی صحیح.

لەپێـشوودا سـەردانی گورسـتانم لـێ قەدەغـە کردبـوون بـەڵام ئیـستا سەردانی بکەن.

بۆیە بەردەوام سـەردانی گۆرسـتانیان دەکـرد کەسـی وایـان هـەبوو هەموو رۆژ ئەم سەردانەی ئەنجام دەدا بۆ؟

چونکە خەمەکانیان دەبردو ئاسوودەیی‌و بەختەوەریان دەهێنایەوەو دونیا یان دەبردو ئاخیرەتیان دەهێناوەو کزی و لاوازی ئیمانیان تێر شەحنی تەقوا دەبوو.

گۆریان گۆرستان شارێکە زۆر سەیرو سەمناکە، سەرەوەی ئەمشارە کرو کەپو ماتە بەڵام لەژێرەوەی هەر خوا بەخۆی دەزانێ چی دەگوزەرێ‌و روودەدات ، پێغەمبەر (ﷺ)هەندێك ئاماژەمان بۆ دەکات‌و دەفەرمووێ:

کاتێك بەندەلەناو قەبردانرا دووفریشتە دێنەلای و پێی دەڵێن چی دەڵێی لەبارەی ئەم پیاوە پێغەمبەر (ﷺ ) دەڵێ شایەدی دەدەم کەئەمە بەندەو نێردراوی خوایە، فقال (انظر الى مقعدك من النار، ابدلك الله به مقعدا من الجنة).

واتە: سەیری شوێنەکەی خۆت بکە لەئاگر بەڵام خوای گەورە بۆی گۆریەوە بەشوێنێك لەبەهەشت، کەچی کافریان دوورەوەکان دەڵێ (لاادری) واتە نازانم ئەوە دەڵێم کە خەڵك دەیلێن، پێی دەڵێن هەر نەزانی‌و نەت خوێندەوە، پاشان یەك چەکوشی ئاسنی لە پستە سەری دەدەن‌و هاوارێکی لێ دەردەچێ، هەموو گوێیان لێ دەبێ تەنها جن‌و مرۆڤەکان نەبێ (البخاری).

لەکتێبی (سنن الصالحین و سنن العابدین– ابو الولید الباجی) دا هاتووە دەڵێ: پێمان گەیشتووە علی کوڕی ابو تالب (خودای لێ رازی بێ) چووە ناو کوفەو لای دا گۆرستان‌و سەلامی لەمردوان کردو ئینجا

فەرمووی (طوبى لمن ذكر المعاد،وعمل للحساب وقنع بالكفاف ورضي عن الله تعالى) واتە خۆش بەختی و سەركەوتن بۆ ئەو كەسەی كەبیری گەڕانەوە (قیامەت) دەكاتو كاربۆ رۆژی لێپرسینەوە دەكاتو قەناعەتی بەوە هەیە كەبەس بژیێ ، رازیشە لەخوای میهرەبان ، (ثم قال) یا اهل القبور اما الازواج فقد نكحت واما الدار فقدسكنت واما الاموال فقد تقسمت).

واتە: دوای وتنی ئەی خەڵكی گۆرستان خێزانەكانتان شویان كردەوەو خانوەكانتان كەسی دیكە هاتووە تێدا دانیشتووە وماڵو سامانەكانیشتان دابەش كراوە ئەوە هەواڵی ئێمەیە بۆ ئێوە ئەی هەواڵی ئێوە بۆ ئێمە چییە؟

پاش كەمێك رووی لەهاوەڵەكان كردو فەرمووی وەڵاهی ئەگەر قسەیان بكردایە دەیانووت (وجدنا خيرا الزاد التقوى) واتە دیتمان باشترین توێشوو تەقوایە.

ئەبو وەلید دەڵێ عومەری كوڕی فرقد شەوانە بەسواریەكەی دەردەچو لەسەر گۆرەكان رادەوەستاو دەیفەرموو ئەی خەڵكی گۆرستان كتابەكانتان داخراو كردەوەكانتان بەرز بووەوە ئینجا دەگریا تابەیانی ئەمە حاڵو وتەی بوو ئینجا دەگەڕایەوە نوێژی بەیانی بەجەماعەت دەكرد.

ئەبووەلید دەڵێ احمد كوڕی حنبل دەفەرمووێ: عوسمانی كوڕی عەففان (خوا لە هەرسێكیان ڕازی بێ) لەسەر گۆڕ رادەوەستا و دەگریا

تاریشی پڕ فرمێسك دەبوو پێیان دەفەرموو (رەحمەتی خوای لێ بێ) بۆ باسی بەهەشتو دۆزەخ دەکرێ ناگرێی بەڵام کەلەسەر گۆر رادەوەستی بەکوڵ دەگرێی، دەیفەرموو هیچ مەنزەرێکم نەبینیوە ئیلا گۆرستان ترسناك ترە لەوی، بێگومان یەکەم مەنزلگای رۆژی دواییە، ئەگەر خاوەنەکەی لەگۆڕ دەربازی بوو ئەوا ئەوەی دوایی هەمووی ئاسانە، بەڵام ئەگەر دەربازی نەبوو ئەوا ئەوەی دوای ئەو زۆر سەخت ترو سامناکە.

ئەبوو وەلید دەڵێ هەندێ لە حەکیمەکان دەفەرمووون: گۆڕ بەمردوو دەڵێ کاتێك لەناویان دانا ماڵ وێران ئادەمیزاد بۆ سەرکەش بووی ئایا نەت دەزانی (اني بيت الفتنة وبيت الظلمة وبيت الوحدة وبيت الدود) واتە: من ماڵی ناخۆش وفتنەم ماڵی تاریکیو ماڵی کرمم.

ابو وەلید دەڵێ ابن كثير فەرموویەتی (خوا لێیان رازی بێ): خوای گەورە پێی ناخۆشەو پێی ناپەسەندە بۆتان کە جوڵە جول لەنوێژ وقسەی بێمانا لەبەرۆژو و بوونوپێکەنین لەسەر گۆرستان.

ابو وەلید دەڵێ سوفیانی سەوری فەرموویەتی: هەرکەسێك زۆر بیری قەبر بکات خوای گەورە بۆی دەکاتەباخێ لەباخەکانی بەهەشت ،هەر کەسێکیش لێی بێ ئاگابێ لێی دەبێتە دۆڵێك لەدۆڵەکانی جەهەننەم.

ابو وەلید دەڵێ (خودا لێی رازی بێ) هەیسەمی کوڕی مالك فەرموویەتی: ئێمە لای (ئەیفەع وئەبوعطیە) بووین کە دوو زاناو ئەولیای

خوان باسی خۆشبەختی کرا یەکێك پرسیاری کرد کێ خۆشبەخترین کەسە لەژیانیدا گوتیان فلان و فلان.

ئەیفەع گوتی چی دەڵێی یا ئەبا عطیە گوتی:

من پێتان راگەیەنم لەوانە خۆش بەختر کێیە فەرمووی (جسد فی لحد أمن العقاب) واتە لاشەیەك لەناو گۆڕ لەسزا پارێزراوبێت.

ئەبو وەلید دەڵێ عومەری کوڕی خەتتاب لەئەبو زەری پرسی (خوا لەهەرسێکیان رازی بێ)

ئەی ئەبازەر کێ بەختەوەرترین کەسە؟ فەرمووی: لاشەیەك لەناو خۆڵ لەسزا پارێزراو بوو بێ و چاوەڕێی پاداشتیش بکات، فەرمووی راست دەکەی.

# بەرزەخ

کە ژیانی دونیایی هەریەکەمان تەواو دەبێ و دەمرین پێش هاتنی ژیانی رۆژی دوایی ژیانێك لەونێوانە هەیە ئەویش لەناو گۆڕە (قبر)کە پێی دەوترێ ژیانی بەرزەخ. ژیانی دونیا جیهانێکی ئاوەدانەو ئالۆزە بەلاَم گۆڕستانەکان کش و مات و بێ دەنگن لەسەرەوە- کەچی ژێرو قولاَییەکەشی ژیانێکی زۆر سەیرو سامناکە ئەو کاتە دەبینین و تێ دەگەین کە بردراینە وێ، خوای گەورەدەفەرموێ ﴿ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ ﴾ ئینجا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێ ( القبر إما روضة من رياض الجنة وإما حفرة من حفر النار).

ئەوانەی بۆیان دەبێتە باخێك لەباخەکانی بەهەشت ئەوا زۆر شادومانن گەلێك کەیفیان خۆش دەبێ بەلاَم ئەوانەی بۆیان دەبێتە چالێك لەچالەکانی دۆزەخ حالیان زۆر شڕەو نالەو هاواری زۆریان لێوە دێ.

تەبەرانی لەئەبوهریرە دەگێڕێتەوەو کە فەرمویەتی جارێك لەگەلّ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ بەرێکردنی مردویەك دەرچووین، لەسەر گۆڕێك دانیشتین و فەرموی (ما يأتي على هذا القبر إلا وهو يناد بصوت ذلق: يا ابن آدم نسيتني، ألم تعلم أني بيت الوحدة الغربة وبيت الوحشة وبيت الدود وبيت الضيق الامن وسعى الله عليه).

واتە: هەر رۆژێ بەسەر ئەم گۆڕەدا دێ بەدەنگێکی زولاڵی گەورە دەڵێ هۆ ئادەمیزاد منت لەیاد چوو؟ ئایا نەت دەزانی من خانووی تەنیایی و خانووی نامۆییو تاریکی و خانوی کرمو تەنگیم بۆ کەسێك نەبێ کە خوا بۆی فراوان کردبێ. (ترغيب وترهيب /ج٤/ل٢٣٨).

## چی لەگەڵت دێ

بەڕێزەکەم چۆن لەسکی دایکت هاتیە دەرەوە بە روتو بێ سامانی وهیچت پێ نەبوو ئەوهاش دەچیەوە ناو سکی خاك هیچ لەگەل خۆت نابەی ، خودا دەفەرموێ ﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴿٩٤﴾ ﴾ . لەکوێن ئەو هەموو مولك ومالەی شەوو رۆژ خۆت بە فیداکردبوو؟ لەکوێ یە ئەو هەموو پارەو پوولەی ساڵەهای ساڵ بوو کۆت دەکردەوە؟! لەکوێن ئەو هەموو منداڵەی بەخێوت کردون؟! لەکوێ یە ئەو شەهادەی چەندەها ساڵ رەنجت بۆ داو شەونخونیت بۆ کرد؟!

ئاخ کە هەموویان دەستت لێ هەڵدەگرنو دەگەڕێنەوە، لەبوخاریو مسلم دا هاتووە، سێ شت دوای مردوو دەکەونو تا لێواری قەبر، کەسو کارو ماڵەکەی دەگەڕێنەوەو تەنها کردەوەکەی لەگەڵی دەمێنێ.

بەندەی خوا پاش تۆزێکی تر دەرگای گۆڕت لەسەر دادەخەن و ئیتر ئەم کردەوانە چارەنوست دیار دەکەن، یان بۆت دەکەن بە باخ یان چالێکی ئاگر.

ئامان بەڕێزەکەم چەند رووت لەکەس‌و کارو ماڵو دنیایە سەد ئەوەندە رووت لەکردەوە بێ و چاکو باشیان بکە.

# گۆڕەشار

هەروەکو لە النسائی والترمذي والطبراني والبیهقی هاتووە لە ابن عمر دەگێڕتەوە (رەزای خوایان لێ بێ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەو سەعدەی کوڕی موعازەی کە بارەگای خودا بۆی هاتە خرۆش‌و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ خرانە سەر پشت و حەفتا هەزار فریشتە هاتن بۆ بەرێ کردنی تەرمەکەی لەگەڵ ئەوەش گۆڕەشارێکی وەها درا کە پەراسووی راست‌و چەپی تێك پەڕاندرا ئینجا قوتاری بوو) لەریوایەتێکی تردا هاتووە ئەگەر کەسێك لەگۆڕەشار قوتاربووایە سعدی کوڕی معاز قوتاری دەبوو (خودا لێی رازی بێ).

هەرچەندە زانایان دەفەرموون گۆڕەشاری ئیمانداران ئاسان‌و سووکە، بەڵام هی کافران وەکو پەستانی بەردێکە بۆ سەر هێلکەیەك، خودا پەنامان بدات.

# پرسیاری ناو گۆڕ:

پاش ئەوەی خۆڵیان بەسەرت داکردو قەپاتیان کرد دوو فریشتەکەی خودا دێنە لاتو حسابێکی سەرەتاییت لەگەڵ دەکەن تاکو تێ بگەی داخوا لەژیانی قەبر سەرکەوتوی یان دۆڕاوی، چونکە ماڵی ئیمانداران لەگۆڕدا جیایە لەهی کافرو دوو رووەکان، ماڵی کافرو مونافیقەکان گەلێك شڕەو هەروەکو رۆح کێشانەکەیان، لەبوخاریو موسلیم دا هاتووە بەندە کاتێ لەناو گۆڕەکەیدا دایدەنیشێنن‌و برادەرەکانی دەگەڕێنەوە هێشتا گوێ ی لەچرپەی پێڵاوەکانیانە دوو فریشتەکە دەگەنە سەریو دایدەنیشێنن‌و پێی دەڵێن: باوەڕت چییە دەربارەی ئەم پیاوە، (محمد) صلی الله علیه وسلم، جا ئەوەی ئیماندار بێ دەڵێ (أشهد أنهُ عبدالله ورسوله) ئەوجا پێی دەگوترێ ئائەوە جێگەی تۆ بوو لەناو ئاگری دۆزەخدا سەیر کە خودا بۆی گۆڕیەوە بەو شوێنە خۆشەلەبەهەشتدا. ئەویش هەردوو جێگە بە چاوی خۆی دەبینێ، لەریوایەتێکی تردا هاتووە لەئاسمانەوە بانگ دەکرێ بەندەکەی من راستی کرد لەبەهەشت جێگەی بۆ رابخەن‌و دەرگایەکی بەرەو بەهەشت بۆ بکەنەوە ئینجا بۆن و بەرامە خۆشەکەی بەهەشتی دەگاتێ‌و گۆڕەکەی بە قەد بینینی چاو بۆ فراوان دەبێ.

بەڵام کافرو دوو روو هەمان پرسیاری لێ دەکەن‌و دەڵێ (لا أدری کنت أقول ما یقول الناس)ئاگام لەهیچ نییە ئەوەندە هەیە خەڵك چیان گوتوە ئەوەم گوتوە ئەوجا دەڵێن دەك هەر نەزانی ئیتر یەك تۆبزی ئاسنی لێ

دەدریٚ قیژەیەك دەكا هەرچی دەوروبەریەتی دەیبیستیٚ مرۆڤ و جنۆکە نەبیٚ ئەو دوو تاقمە نایبیستن.

لەگەڵ دوو پرسیارەکەی تر ئەوانیش من ربك؟ ، ما دينك؟ بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە (پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾

واتە: خوای گەورە ئیمانداران جێگیر دەکات لەناو گۆڕ بەو وشەیەی کەلە دونیا لەسەری بوونە ئەویش (لا اله الا الله محمد رسول الله).

ئیمامی عوسمان –ڕەزای خوای لێ بێت – دەگێڕتەوە، گوتی (پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم) کەلەناشتنی مردوو دەبۆوە لەلای گۆڕەکەی رادەوەستاو دەیفەرموو بپاڕێنەوە بۆ ئەو برایەتان داوای دامەزراندنو راگیرکردن لەسەر ئیمانی بۆ بکەن ئێستا پرسیاری لێ دەکریٚ . رواه أبو داود.

## کردەوەکانت:

دوای ئەوەی دوو فریشتەکەی خودا پرسیارو وەڵامیان تەواو دەبیٚ لەگەڵ پیاوی خواپەرستو ئیماندار، لەئەحمەدو سونەنی ئەبوداود ج٢ ل٢٤ ژمارە ٤٧٥٣ لەبەڕاء گێڕاویانەوە : پیاوێکی روو جوانو گەشو جلو بەرگێکی بۆن خۆش دێتە لایو پێی دەڵیٚ مژدەت دەدەمیٚ بەشتێك کە زۆرت لا خۆشە، ئەوە ئەو رۆژەیە کە بەڵێنت پیٚ درابوو، ئەویش دەڵیٚ تۆ کێی ؟ رەنگو رووە جوانەکەت هەر خێری پێوە دیارە؟ دەڵیٚ:

من کارو کردەوە جوانەکانتم. ئینجا لەخۆشیا دەڵێ: (رب أقم الساعه ، رب أقم الساعه، حتى أرجع إلى أهلي ومالي) خوایە قیامەت هەڵسێنە ، خوایە قیامەت هەڵسێنە، تا بگەڕێمەوە بۆ لای ماڵو مناڵەکەم.

بەڵام هەرچی پیاوی کافرو دووڕووە.

پیاوێکی ڕوو ناشرینو جلو بەرگ پیسو بۆن ناخۆش دێتو پێی دەڵێ: مژدەت دەدەمێ بەشتێ کە زۆرت پێ ناخۆشە، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنت پێ درابووە ئەویش دەڵێ تۆ کێی؟ ڕەنگو ڕووە ناشیرینەکەت هەر خراپەی پێوە دیارە، دەڵێ من کارو کردەوە پیسەکانتم، ئینجا دەڵێ خوایە قیامەت هەڵمەسێنە.

# پاداشتو سزای ناو گۆڕ:

١–پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ئێوە کاتێ دەمرن (عرض عليه مقعده بالغداة والعشي ) بەیانیان وئێواران هەر کەسەتان جێگەی خۆی نیشان دەدرێ جا ئەگەر بەهەشتی بێ ئەوا جێگاکەی خۆی لەبەهەشت دەبینێ و پێی دەڵێن (هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة ) ئەوە جێگاتە کە خودا زیندوی کردیەوە لەقیامەت دێیتە ئێرە.

٢–ئەنەس خودا لێی ڕازی بێ گوتی پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لێ بوو گۆڕێ دەنگی لێوەهات فەرمووی ئەمە کەی مردووە؟ گوتیان لەسەردەمی جاهیلی فەرمووی (لولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم

من عذاب القبر) نەبادا لاشەی یەکتری نەنێژن ئەگینا داوام لەخوا دەکرد کە کارێکی وای بکردایە کە گوێتان لەسزاو ئازاری ناو گۆڕ بوایە. مسلم.

٣-هانی خزمەتکاری ئیمام عوسمان (رەزای خوای لێ بێ) گوتی: عوسمان لەسەر گۆڕ دەوەستا ئەوەندە دەگریا تا ریشی بە فرمێسك تەڕ دەبوو، پێیان دەگوت: بۆ کە باسی بەهەشتو دۆزەخ دەکەیت ناگریت کەچی بۆ ئەمە دەگریی، فەرمووی چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (إن القبر أول منازل الآخرة، فإن نجا منه فما بعده أيسر منه وإن لم ينجُ منه بعده أشد منه) گۆڕ یەکەم هەواری دوارۆژە ئەوەی لەوێ رزگاری ببێ ئیتر لەقۆناغەکانی پاشتر ئاسانتر رزگاری دەبێ ، خۆ ئەگەر لەوێ رزگاری نەبێ ئەوا لەقۆناغەکانی دواتر خراپتر گیرۆدە دەبێ گوتی پێغەمبەر (ﷺ) دەشی فەرموو( ما رأيت منظراً قط إلا والقبر أفضع منه ) هەرگیزاو هەرگیز دیمەنم نەدیوە کە وەك گۆڕ سامناكو بەسام بێ). (ابن ماجه والترمذي ج٢ ل٥٦٨).

٤-دەبێ بزانین ژیانی بەرزەخ بە خۆشیو عەزابەکەیەوە هەموو کەس دەیبینێ جا لەقەبر نێژرابێ یان نا، تەنانەت ئەگەر هاتوو درەندەش بیخوات یان لەناو خنکابێ یان بووبێتە خۆڵەمێش یان...هەروەکو لەشەرحی عەقیدەی تەحاوی هاتووە.

# گۆڕ لەبیرمەکە:

بەندەکانی خوا هەرگیز نەیەڵن ژیان و هەراو قەڵەبالغی ئەم دونیایە گۆڕو شەوەزەنگو تەنگیو تاریکیەکانیت لەبیر بباتەوە لەزەخیرە دانانت بکەن بۆیە ناوە ناوە سەردانی گۆڕستان بکەو کەمێك بیر بکەوە و خۆت بێنە بەرچاو وا ئەوانەی لەناو ئەو گۆڕەدان رۆژێك لەرۆژان لەسەر دنیا بوونو لەگرمەی تاقی کردنەوە بوون، تۆش ئێستا وەکو پێشووی ئەوان لەتاقی کردنەوە دایو رۆژێك دادێ دەبێ بمریو بەسەر شانی خەڵکی لەناو دارەبازە بهێنرێ یە گۆڕستان وماڵت ئەم شوێنە بێ.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی ( قد كنت نهيتكم عن زيارة القبور ، فقد أذن لمحمد في زيارة قبر أمه فزوروها فإنها تذكر الآخرة) رواه مسلم.

لەمەو پێش جاران نەهیم لێ دەکردن لەزیارەتی گۆڕستان بەڵام ئەوا رێگەی من دراوە زیارەتی گۆڕی دایکم بکەم کەوابوو ئێوەش لەمەودوا زیارەتی گۆڕستان بکەن چونکە گۆڕستان یادی قیامەت تازە دەکاتەوە.

*بەراء –خودا لێی رازی بێ– گوتی : جارێك لەناشتنی تەرمێکدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووین لەسەر لێواری گۆڕەکە دانیشتو گریا تا خۆڵەکە تەڕ بوو ئینجا فەرمووی ( يا إخواني لمثل هذا فأعدوا) شرح السنن و ابن ماجه ج٢ ل٥٤٨. هۆ برایانم بۆ شتێکی ئەوها (مەبەستی گۆڕە) خۆتان ئامادە بکەنو زەخیرە دابنێن.

جا ئەگەر گۆڕێک پێغەمبەر (ﷺ) ی هێنابێتە گریان دەبێ ئێمە دەیان ئەوەندە لێی بترسێین و زەخیرەی بۆ دابنێین چونکە هەتا لەسەر دنیای دەتوانین زەخیرە دابنێین و خۆمان ئامادە بکەین‌و کردەوە کۆبکەینەوە کە مردین‌و چوینە نێو گۆڕ هیچ ناکرێ هیچ ناکرێ.

إنا لله وإنا إليه راجعون

# شەو نوێژ

دەبێ بزانین شەوو رۆژ دوو بەڵگەو دووئایەتی خوای گەورەن لەم گەردوونە گەورەو فراوان و عەجایبەدا، بەهرەی شەو ئەگەر لەرۆژ گەورەترو گرنگتر نەبێ کەمتریش نییە.

بەڵکو شەو لای ئیمانداروتەقوادارو ئەولیاکان دەریایەکی پڕ لەگەوهەرو مرواریيە مایەی حەسانەوەی دڵو رۆح و ئارامیيە بۆ نەفس و گیان. شەو لای صالحین سەرنجدان و وردبوونەوەیە لەئاسمان و رێسمان.

لای پێغەمبەران (علیە السلام) و خوا پەرستان و تەقواداران شەو کاتی مناجات و گفتوگۆیە لەگەڵ محبوبو خۆشەویستەکەیان کە خودای خالق و میهرەبانە (سبحانە و تعالی).

مناجات دوعاو پاڕانەوەو میحرابی نوێژو زیکربەفرمێسکی چاو و کرنۆش و سجدە. شاعیری خوا پەرستت زۆر بەوردی باسی ئەم گەوهەرەی شەو دەکات و دەفەرمووێ:

شەو نوێژ و خەلوەت بەینی بارانە
جێی رازو نیازی دەردەدارانە
فرصەت و غەنیمەت، ماڵ بێ ئەغبارە
عالەم نووستوەو دۆست خەبەر دارە

خودای گەورە لەقورئانی پیرۆز دەفەرمووێ: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ السجدة: ١٦

ئیمانداران لەسەر جێگای نووستن هەڵدەستنەوەو هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان لەپەروەردگارە لەدۆزەخ دەترسێن چاوەڕوێی بەهەشتیش دەکەن لەو رزقو رۆزیەی خوا پێی داون دەی بەخشن بەندەی خواناسو باوەڕدار لەگەرمەی شیرینی خەوو لەئامێزی پشوو ئارامی و حەسانەوەی شەودا دادەچڵەکێو هەڵدەستێتەوە، نوێنو جێی خەوەکەی بەجێ دێڵێ نێوانی لەگەڵ خەوجێی خەودا خۆش نییەو بەئاوێکی فێنك دەستنوێژکی پاكو بێ گەرد دەشوات.

بەدڵێکی پاك و بێ گەرد روو دەکاتە پەروەردگاری میهرەبانو نوێژێکی پڕ (خشوع دەکات سەردەخاتە سەرزەوی و سەجدەی زەلیلی بۆ خودای باڵادەست دەبات ئینجا.

بیری دەکاتەوە، یادی دەکات، ناوی دەبات، لێی دەپارێتەوە، دەیپەرستێت، چاوەکانی لەخۆشیا پڕ فرمێسك دەبێ، دڵی پڕ تەقوادەبێ شەحنی ئیمانی تێر دەبێو ورەی بەرز دەبێ خۆراگر دەبێ بەرامبەر گەردەلولە شەراویەکانی رۆژ، خزمەت دەکا.. . دەعوە دەکا... دەڵێ ... دەنووسێ.. دانانیشێ... خەوناناسێ.. تا ئەو رۆژەی مردن دەبێتە

میوانی، ئەمەیە کارمەندی کاروانی پیاو صالحانو هاوەڵو دۆست ئەولیاو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام).

پلەو پایەی ئەو کەسانە هێندە بەرزە کەلەچەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا باسیان کراوە، خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ﴾ الزمر: ٩.

ئەو ئیمانداراەی کە لەدوو توێی شەوگاردا هەڵدەستێ بۆ خواپەرستیو سوژدە دەباتو بەپێو دەوەستێتو لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێ ئومێدو هیوای بەمیهرەبانی پەروەردگاری هەیە.

بێگومان خوای گەورە لەهەموو کەسێك خۆش دەبێت کە داوای لێخۆشبوونی لێبکات پەشیمان بێو تەوبە بکات لەگوناهەکانی رابردوو، خوای تعالی وەلامی هەرکەسێك دەداتەوە دوعا بکات و بپارێتەوە لێی بەتایبەتیش دوعای ئەو کەسانەی لەگەڵ سەبای صالحان دەپارێتەوەو دەڵێت (خودای تعالی ئێمە هانامان بۆ تۆ هێناوەو لەگوناهەکانمان ببوورەو لەسزای ئاگر بمانپارێزە).

﴿ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ ﴾ آل عمران: ١٦-١٧

هەروەها خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾﴾ الذاريات ١٦-١٨ — ﴿كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾

ئیبن عباس دەفەرمووێ لەبارەی ئەم ئایەتە (لم تكن تمضي عليهم ليلة لا يأخذون منها شيئا). واتە: هیچ شەوێك بەسەریان تێپەرنابێت کەشتێکی لەنوێژ تێدا ئەنجام نەدەن. ئەو تەقوادارانەی خوای گەورە بە(عباد الرحمن) ناوی بردون یەکەمو سەرەتای سیفەتیان شەو نوێژەو ﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾﴾ الفرقان: ٦٤

ئەوانە کە شەو دادێ بۆخوای خۆیان سجدە دەبەنو بەپێوە دەوەستن.

ئیمامی بوخاری فەرموودە لەسالمی کوڕی عبدالله کوڕی عمر (خودای گەورەلەهەموویان رازی بێ) دەهێنیەوە کە عبدالله دەڵێ خەڵك خەونیان دەبینیو بۆ پێغەمبەریان (ﷺ) دەگێڕاوە،منیش تەمەننام دەکرد خەونێك ببینم و بۆی بگێڕمەوە تارۆژێك لەناو مزگەوت نوستم خەونێکم دیتو بۆ حەفصەی خوشکم گێڕایەوە ئەویش بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وفەرمووی (نعم الرجل عبدالله لو كان يصلي من الليل)، فكان بعد لاينام من الليل الا قليلا.

واتە: عبدالله باشترین پیاوە ئەگەر بەشەو نوێژ بکات، لەپاش ئەوە نەدەنوستم لەشەودا تەنها کەمێك نەبێ.

ئەو ئیبنو عومەرەی (٣٠) ساڵ شەو شەونوێژی نەچوو بەرۆژییش ڕۆژەك نارۆژەك بەرۆژوو بوونی لەدەست نەدا، باوکیشی (٣٣) ساڵ ئەم شەو نوێژەو بەرۆژوو بوونەی لەدەست نەدا.

عن ابي هريرة (رضى الله عنه) قال . قال الرسول (ﷺ) (افضل الصلاة بعد الفريضة قيام الليل) مسلم وترمذي والنسائي .

واتە: باشترین نوێژ دوای فەرزەکان شەو نوێژە.

*لەبوخاری و مسلم داهاتووە پێغەمبەر (ﷺ) شەوێ دەچوو لەدەرگای ماڵی فاتیمەو عەلی (خودا لێیان رازی بێ) دەدا دەیفەرموو هەڵناستن شەو نوێژ بکەن.

ابن بطال (خوای لێ رازی بێ) دەفەرمووێ ئەمە گەورەیی شەو نوێژە بۆیە پشوو لەکچ و ئامۆزای تێك دەدات.

**★ ئیمامی ترمزی بەسەنەدێکی صحیح دەهێنێتەوە.**

کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو رۆژەی هاتە مدینە خەلك چوونە پێشوازی و قەلەبالغی دروست بوو یەکەم ووشە فەرمووی : (يا ايها الناس افشوا السلام واطعموا الطعام، وصلوا الارحام وصلوا باليل والناس ونيام تدخلوا الجنة بالسلام).

*لەموسلیم وبوخاریدا هاتووە دایکە عائیشە (خوای لێ رازی بێ دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵدەستا شەو نوێژی دەکرد تاکو قاچەکانی دەئاوسا ، پێم دەوت ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆ خودا لەگوناهی پێش و نێوانی بدێ بووە بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی،

دەیفەرموو: (افلا ان اکون عبدا شکوراً) واتە: ئایا بەندەیەکی سوپاس گوزارنەبم.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ (ینزل الله تعالى كل ليلة الى سماء الدنيا فيقول:هل من سائل فأعطيه هل من مستغفر فأغفرله).

واتە: کێ داواکاریەکی هەیە پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوون دەکات لێی خۆشبم بێ گومان ئێمە هەمومان موحتاجی خوداین وداوا کاریمان زۆرە لە مندالّ،علم، تەقوا، قەرز، نەخۆشی، فتنە، وەدەیان بواری دیکە، کەواتە لەسێیەکی کۆتایی شەو هەڵسەوەو داوای ئەم پێداویستییانەت بکە خودای میهرەبان وەلآمی هەمووت دەداتەوەو پێت دەبەخشیو لێتخۆش دەبێ.

*ابن عباس (خودا لێ رازی بێ) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) ھانمان دەدات بۆ شەونوێژو دەفەرمووێت (علیکم بالصلاة اللیل ولو رکعة) رواه الطبراني شەو نوێژ بکەن ئەگەریەك رکعەتیش بێ، کەواتە شەو نوێژ لەیەك رکعەت دەست پێ دەکات تا چەندین رکعەت کە دەتوانی بەلآم واباشە یانزە رکعەتی زۆر ئەنجام بدەی کە فەرموودەی صحیحی لەسەرە،کەواتە لێنەگەرێی شەو بەسەرتدا تێپەرێ ئیلا رکعەتێك یان زیارت تێدا ئنجامدا بیت.

بەلآم زیاتر پێغەمبەر (ﷺ) (١١) یان (١٣) کردوە، لەدوای عیشا تابەیانی بەشەونوێژ (قیام اللیل) حیسابە، بەجەماعەتیش دەکرێ، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوڵانی بەکۆ ئەنجامیانداوە ئەگەر

نەتوانی جارێك شەونوێژ ئەنجام بدەی ئەوا عیشاو بەیانیەکە بەجەماعەت لەدەست نەدەی چونکە عیشا بەجەماعەت نیو شەو نوێژەو بەیانیش نیوەکەی دیکە هەروەکو لەمسلم داهاتووە.

لەمسلم وبوخاریدا هاتووە: ئەگەر خەڵك بیانزایە چ خێرێك لەبەیانی وعیشادا هەیەئەوا (لأتوهما ولو حبواً) دەهاتن بۆ جەماعەت ئەگەر بەگاگۆلەش بوایە، سبحان الله دەبێ چەندە گرنگ بێ نوێژی جەماعەت لەناو تاریکایی شەودا.

# حوکمی شەو نوێژ

ابن عبد البر دەفەرمووێ واجبە بەڵام جەماعەتی عولەما پێیان سونەتە.

ابن اسحاقیش دەفەرمووێ واجبە لەسەر (اصحاب القرآن).

# چۆنیەتی شەو نوێژی پێغەمبەر (ﷺ)

١- زۆر راوەستان لەنوێژدا

ئیمامی موسلیم لەخوزەیفەی کوڕی یەمان دەگێڕتەوە دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژم کرد لە شەودا ( البقرة. ال عمران. النساء)ی لەیەك رکاتدا خوێند.

پاشان هەڵساو رکاتی دووەمیشی وەکو یەکەم خوێند نەك ئەوەندە بەڵکو رکوعەکەشی بەقەد راوەستانەکەی بوو پاشان سجدەکەشی بەقەد وەستانو رکوعەکەی بوو..

٢-لەموسلم و بوخاری هاتووە ئیبن عومەر (رەحمەتی خودا لەهەرسێکیان) دەفەرمووێ پێغەمبەر (ﷺ) شەو نوێژەکانی دوو رکاعەت دوو رکعات بوونو (مثنى مثنى) لەنێوان هەردوو رکاعەت سەلامی دەدایەوە کۆتاییەکەشی دەکردە ویتر.

٣- ئیبن حجر (رحمەتی خودای لێ بێ) لە فتح الباری دادەفەرمووێ لەفەرموودەی صحیح داهاتووە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم: لەسەرەتای شەوو ناوەڕاست و کۆتاییش شەو نوێژی کردوە بەڵام مەدحی باشترین کاتی کردوە ئەویش سێیەکی کۆتایی شەوە کەتێیدا خوای گەورە دێتە ئاسمانی دونیا.

# چەند هۆکارێك بۆ ئاسان کردنی شەو نوێژ

بیزانە شەونوێژ قورسە لەسەر خەڵکی مەگەر خوای گەورە ئەوکەسە موفەق بکات بۆ ئەم کارە، چەند هۆکارێکی ناوەکیو دەرەکی هەیە کەیارمەتی دەرن بۆ ئەم کارە .

## هۆکارە دەرەکیەکان

١- زۆر نەخۆی تاکو زۆر نەخەوی.

٢- لەرۆژدا خۆت زۆرماندوونەکەی کەدەبێتە هۆی ماندو بوونی جەستە و مێشك چونکە ئەو ماندووبونانە خەو دەهێنێت.

٣- واز لە قەیلولە نەهێنێ کەیارمەتی دەرە بۆ هەڵسان لەشەودا.

٤- زۆر گوناهە ئەنجام نەدات کەئەمەش دڵ رەقدەکات.

دەبێتە هۆی دورکەوتنەوە لەرەحمەتی خوا.

قال الثوري : (حرمت قيام الليل خمسة اشهر بذنب اصبته).

واتە مەحروم بووم پێنج مانگ لەشەونوێژ بەهۆی گوناهێك کەتوشم بوو.

بیزانە هەمووگوناهەکان کاریگەریان هەیە لەسەر دڵ رەقو بوونو دەبنە رێگر بۆهەڵسان لەشەو بۆ نوێژو نزاو پارانەوەو مناجاتو یادو زکر بەتایبەتی خواردنی پارووی حەرام.

# هۆکارە ناوەکیەکان

**١- دڵ پاکی و سەلامەتی لەبیدعەو رق لێ بوونەوەی موسڵمانانو دوورکەوتنەوە لەخەفەتی دونیا.**

هەریەکێك لەم سێیە کاریگەری تەواویان هەیە لەسەر لەدەست دانی شەونوێژ، بۆیە موبتەدیعەکان ناتوانن شەونوێژ بکەن، هەروەها ئەوانەی رقیان لەموسلمان دەبێتەوەو کافرو منافق وعەلمانیەکانیان خۆش دەوێ یان وەلائیان بۆ وان هەیەو برائەتیان لەموسلمانە ئەوانەش ناتوانن بگەنە ئەم پلەیە شەونوێژ ئەنجام بدەن، ئینجا ئەوانەی خەم لەپارەو دۆلارو سەیارەو عاردو خانوو و دوکان.. دەخۆن تاقەتیان نامێنێ شەو نوێژ بکەن چونکە هەموو تاقەتیان بۆدنیا سەرف کرد.

**٢- ترسانێکی زۆر لەخوا کە دڵ پر بکات.**

چونکە خودا ی گەورە دەفەرموویت ﴿فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ عمران ١٧٥

وەدەفەرمووێ ﴿فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ﴾ المائدة ٤٤

بێگومان ترسان لەخودا لەگەڵ (محبەو رجاء ) کەوا دەکات بەندە بەردەوام خودای لەیاد بێت پاشان بەندە بیر لەناخۆشیەکانی قەبرو قیامەتو جهنم بکاتەوە. خەو لەچاوەکانی ناکەوێت لەگەڵ کەم ئومێدبوون بەدونیا (قصر الامل) چونکە کەم هیوا بوون بەدونیا وا دەکات دونیات لە دڵ بچوك بێتەوەو قیامەتت لا گەورەبێ بەڵام ئەوانەی

ئومێدی زۆریان بەدنیا هەیە (طول الامل) ئەوا بەبەدەستهێنانی ئەو هەموو هیواو ئاواتەی دونیایان راناگەن چ جای قیامەت‌و تێکۆشان بۆ دوا رۆژ کە ئاخیرەتە.

**٣- دەبێ بزانی فەزڵی شەونوێژ چەند گەورەیە،**

زانینی ئەم فەزڵەش هانت دەدات بۆ بەدەست هێنانی ئەم پاداشتە گەورەیەو لە دەست نەدانی‌و تیکۆشان بۆی.

* قال ابن المنكدر : مابقى من لذات الدنيا الا ثلاث قيام اليل ولقاء الاخوان وصلاة الجماعة.

واتە: خۆشی لەدونیادا نەماوە تەنها سێ شت نەبێ شەونوێژو بینینی برایەکان‌و نوێژی بەکۆمەڵ.

# شەو نوێژ لای دکتۆر

لەکتێبی (الوصفات المنزليه التجربيه):

بەکۆمەڵێك نوسەری ئەمریکی نوسیویانە لەساڵی ١٩٩٣ چاپ کراوە هاتووە تێیدا.

هەڵسانەوە لەشەودا لەسەر جێگای نوستن‌و پاشان هەندێك جولەی ئاسایی وکەمێك وەرزش و شۆردنی دەم‌و چاو زۆر سودی بۆ لاشەی مرۆڤ هەیە.

لەوان دەبێتە هۆی دەردانی هۆرمۆنی کۆرتیزۆل هەروەها پاراستنی رێژەی شەکرە لەخوێن.

هەروەها کەمبونەوەی پاڵە پەستۆی خوێن (ضغط)
هەروەها پاراستنی لە ئیفلیجیو جەڵدەی دڵ چەندین نەخۆشی تریش...
* کە ئەم حەرەکاتانەش هەمووی واتای شەو نوێژەو بۆیە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێ شەونوێژ بکەن، چونکە (مطردة للداء عن الجسد). واتە لابەری نەخۆشیە لەلاشە.

وصلى الله وسلم على محمد وآله وصحبه أجمعين،
آخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين.

**هەر خە محۆرێك حەز دەكات ئەم پرۆژەیە بەردەوام بێ،**
**بۆ هاوكاری با پەیوەندی بكات بە ( ٠٧٥١٥٦٠٣٩٥٧ )**
**مافی چاپو بڵاوكردنەوەی بۆ هەموو خێرخوازێكە**
**( الدالُ على الخير كفاعله )**

# ناوەرۆك


| لاپەرە | بابەت |
|---|---|
| ٣ | پێشەکی |
| ٤ | بەکەم زانینی دونیا |
| ٤ | بۆچی هاتوینە دونیا |
| ٦ | ژیانی دونیا تاقی کردنەوەیە |
| ٧ | میهرەبان چاکەی لەگەڵ کردوین |
| ٨ | کردەوەکانت تۆمارکراون |
| ٩ | قیامەت مەگۆڕەوە بە دونیای فانی |
| ١٢ | بەندەکانی خوا |
| ١٣ | هەڵ مەخەڵەتێ |
| ١٤ | گـــۆڕ |
| ١٩ | بەرزەخ |
| ٢٠ | چی لەگەڵت دێ |
| ٢١ | گۆڕەشار |
| ٢٢ | پرسیاری ناو گۆڕ |
| ٢٣ | کردەوەکانت |
| ٢٤ | پاداشتو سزای ناو گۆڕ |
| ٢٦ | گۆڕ لەبیرمەکە |
| ٢٨ | شەو نوێژ |
| ٣٤ | حوکمی شەو نوێژ |
| ٣٥ | چۆنیەتی شەو نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) |
| ٣٦ | چەند هۆکارێك بۆ ئاسان کردنی شەو نوێژ |
| ٣٦ | هۆکارە دەرەکیەکان |
| ٣٧ | هۆکارە ناوەکیەکان |
| ٣٩ | شەو نوێژ لای دکتۆر |
| ٤٠ | ناوەرۆك |